


ئەم کۆرسە کوردنیت ئامادەی کردوە

http://www.ekurd.net

# فێربوون و کارکردن لە سەر ئینتەرنێت

بەشی یەکەم 2003

# لێگەرانی ئینتەرنێت – چاوپێخشاندن




**ئینتەرنێت  چیە ؟**

ئینتەرنێت بریتیە لە کۆمەڵێك کۆمپیوتەر و تۆري جیهاني. بنەرەتي  ئینتەرنێت
دەگەرێتەوە بۆ برۆژەیەکي بەرگری ئەمەریکا بە ناوي ئاربا نێت .
(برۆژەی ئاژانسی تۆری تۆژینەوی زانستی پێشکەوتو ARPANET) کە لە ساڵي 1969  دامەزراوە.

ساڵیپار 2003
تەمەني ئیمەیل
گەیشتە 32 ساڵ

لە ساڵی 1983 ئینتەرنێت وەك ئینتەرنێتی ئێستا داهێنرا , بەڵاّم بە شێوەیەکي
تایبەت لە زانکۆ و کۆلیژی وڵاّتە یەگرتوەکانی ئەمەریکا بەکار دە هێنرا .
لەوکاتە وە گەلێتی بەشێوەێکی خێرا بلاّوبۆوە. لە نیوەی ساڵەکانی 1990 دا
ئینتەرنێت لە جیهان دا ملیۆنەها کۆمپیوتەری بەیەکەوە بەست.



ئێستا ئینتەرنێت بە بەشێوەێکی ئاسایي لە مالاٌندا بەکاردێت. ئەو زانیاریانەی کە تێیدایە زۆر چروپر و بەربلاوون ,
هەر لە بواری فیربوون و پەروەردە وە تا  کرینی رۆژەپشوی هەرزان یان ئوتۆمبیل.

**بێوەیي (سەلامەتی)  لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەردا**

کۆمپیوتەر بەستراوە بە کارەباوە. جولاٌندی وایەرەکەی کە بەستراوە بە بەشي
دوواوەی قەدەغەیە, یان پەنجە بردن بۆ ناو کونەکانی مەترسی کارەبا لێدانی هیە.

نان و ئاو خواردن لە پەنا کۆمپیوتەردا هەمووکاتێك پێویسی بە ئاگاداری هەیە. رژاندنی هەمو شلەمەنیەك بەسەر
دوگمەکانی پیتلێدەر (کیبۆرد) یان بەسەر   مۆنیتەرەکەدا (پەخشینەر), دەتوانیٚ زیانێکی هەتەر بە کۆمپیوتەرەکە
بێنێت و شۆرتی کارەبایي دروست بکات لەناو رژێمەکەدا. کەوتنی بەشی خواردەمەنی بۆ سەر و  ناو دوگمەی پیتلێدەر
(کیبۆرد) لە کاریان دەخات.

لە بیرتبیٚ,  بێوەیي (سەلامەتی)  خۆت لەهەموو کاتێکدا لە پلەی یەکەم دایە .

ئینتەرنێت زانستێکی گران نییە, بەلاّم تەکنۆلۆجیایێکی نوێیە و بیٚ خەوشیش نیە, بەلاّم بە ئارام بە, لەگەلٚ کاتدا
تۆش دەبیت بە لێگەرێکی لێهاتوو.

**پێویسنی بۆ پەیوەندی بوون بە ئینتەرنێتەوە :**

- کۆمپیوتەر – زۆربەی بەکارهێنەر ئەم جۆرە بەکار دەهێنێت– هەمیشە خەڵك هەیە تەلەفونی موبایل ,تەلەفزیۆنی دیجیتال, یان جۆرە کۆمپیوتەری مۆبایل بەکار دەهێنن وەك ڕێکایەك بۆ پەیوەندی بوون بە ئینتەرنێتەوە.

- مۆدێم – پەیوەندیت ئەکات بە ئینتەرنێتەوە یان بە کۆمپیوتەری ترەوە لە جیهاندا.
- بەخشەری پەیوەندی ئینتەرنێت
- سۆفت وێر – پرۆگرام – زۆرترین بەکارهاتوو ( ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر – گەرێدە و نێتسکەپ ناڤیکەیتەرەرە)

## Modem مۆدێم چییە ؟

مۆدێم پێویستە بۆ پەیوەندیت بە ئینتەرنێتەوە, بەستراوە بە خەتی تەلەفونەکەتەوە وە بە کۆمپیوتەرەکەتەوە. گەشاندەوەی مۆدێم هاتە کایەوە وەك دروستکردنی کۆمپیوتەر کە لە خەڵك بچێت بە گۆرینی دەیتا (بیانات) بۆ شێوەی دەنگی ئەلەکترونی. مۆدێم دەیتا (بیانات) وەردەگرێ وە دەیکا بە دەنگی و دەینێرێ بە خەتی تەلەفونەکەدا, مۆدێمی دووەم کوبەستراوە بە کۆتایی خەتەمەوە ئەو دەنگە وەرئەگرێت و دەیکاتەوە بە دەیتا (بیانات).

**بەخشەری پەیوەندی ئینتەرنێت ISP (Internet Service Provider)**

**ISP** کۆمپانیایەکە کە خەڵك پەیوەندی دەکات بە ئینتەرنێتەوە. ئەم کۆمپانیانە یان کۆمپانیای جیهانین یەگرتون یان کۆمپانیای خۆماڵین. ئەم **ISP** کۆمپانیانە پرۆگرامی (سۆفت وێر) پێوستان دەداتێ لەگەڵ ووشەی نهێنیدا password و چەند ژمارەی تەلەفون بۆ ئەوەی مۆدێمەکەتان داوای بکات و پەیوەندی ببەستێ بە ئینتەرنێتەوە. ئەم **ISP** کۆمپانیانە خەتی تەلەفونیشیان تەرخان کردوە بۆ یارمەتی و پشتگیری.

هەندێ کۆمپانیای **ISP** پارە وەردەگرێت هەقی پەیوەندیکردن بە ئینتەرنێتەوە, وە هەندێکیان وەری ناگرێت, ئەمە لەگەڵ هەقی پەیوەندیکردن بە تەلەفون. ئێستا هەندێ کۆمپانیای **ISP** مانگانە پارە وەردەگرێت هەقی پەیوەندیکردن بە ئینتەرنێتەوە بەلاّم پەیوەندی تەلەفون بەخۆراییە.

**هەندێ تەکنۆلۆجیا**

**زمانی HTML** HyperText Markup Language

زمانێکە بەکاردێت لە گەشەپێدان و دروستکردنی لاپەڕەی ئینتەرنێت (وێب). ئەم زمانە دیەلێت وێنە و نوسراو تێکەڵ بکرێت بۆ دروستکردنی لاپەڕەی وێب, وە گرنگترین رەوشتی, دەیەلێت لاپەڕەکان بە یەکەوە زنجیرەبکەیت **links** لینکس.

**ناونیشان URL** - Information Resource Locator

بەم ڕێگایە شوێنی لاپەڕەی ئینتەرنێت(وێب) ناونیشان کراوە (ناونیشانی شوێنی وێب)

**وێب** WWW - World Wide Web - the web

بەشێکە لە ئینتەرنێت کە وێنە و نوسراو و دەنگ و ڤیدیۆ بەکاردێنێت وە دەیەلێت تێکەڵ بکرێن بۆ پێشکەش کردنی زانیاری لە هەمو بوارێك دا.

**ماڵەوە – Home**

یەکەم لاپەرەی وێبە (وێب سایت **Web site**) وە ئەو وێب سایتەیە کە ئاوتۆماتیکی دێتە سەر پیشاندەرەکەتان (browser) زۆربەی کات لاپەڕەی کۆمپانیای ISP یەکەتانە.

**لاپەڕە Page** — لاپەڕەی وێب بریتیە لە بەڵگەنامەی HTML یان وێب سایت.

هیپەرتێکست Hypertext — بەڵگەنامەیەکە کە **links** لینکسی تێدایە بۆ لاپەرەی تر, بەکاردێ لە لاپەرەی وێب دا **Web pages** و فایلی یارمەتیدا **help files**.

## ئیشپێکردنی پرۆگرامی (سوفت وێری) پیشاندەر Browser — ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر

دوو ڕێ هەیە بۆ ئیشپێکردن بە ئێکسپلۆرەر. دەتوانن بچن سەر دوگمەی ستارت **Start** کە کەوتۆتە بەشی خواروی, لای چەپی شریتی ئیش **task bar**. دوگمەی پرۆگرامس **Programs** هەڵبژێرە, پاشان ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر **Internet Explorer** سەیری وێنەی خوارو بکە :



یان دووجار کرتەبکە double click بە دوگمەی چەپی مشکۆلەکەت mouse لەسەر ئایکنی icon ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر Internet Explorer لەسەر شاشەکەت (کە پێی‌دەڵێن دێسکتۆپ desktop).

زانیاری

کە پەیوەندی دەکەی بە ISP یەوە , ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەرInternet Explorer دەتوانێ ئۆتۆماتیکی دەست بکات بە ئیش.

URL ناونیشانێکی بێ هاوتایە unique بۆ ئەو لاپەرانەی کە دەتەوێت ببینی.

URLs are just unique addresses of pages you wish to look at.



ناونیشانێکی URL

بێ هاوتایە

بۆ ئەو unique

لاپەرانەی کە

دەتەوێت ببینی

Uniform Resource Locator

## هەڵبژاردنی لاپەرە بە بەکارهێنانی ناونیشان URL

ناونیشانی لاپەرەی ئینتەرنێت (وێب) زۆربەی‌کات بە www دەست پێدەکات, وە ناسراوە بە URL




کرتەیەك بکە لەسەر شریتی ناونیشان Address bar و ناونیشانی ئەو لاپەرەکە بنوسە کە دەتەوێ ببینی. هەر یەکێك لەم ناونیشانەی خوارو تاقی بکەرەوە یان ناونیشانێك بنوسە بە ئارەزوی خۆت.

- **www.bbc.co.uk**
- **www.itv.co.uk**
- **www.lastminute.com**
- **www.cadbury.co.uk**

ئامۆژگاری

**کە یەکەم کرتە دەکەیت لەسەر شریتی ناونیشان address bar کشتی ناونیشانەکە دەبیٚ بە ڕەنگی شین. کەواتە پێویست ناکات ناونیشانە کۆنەکە بسرِیتەوە. هەر یەکسەر دەست پیٚ بکە بە نوسین , ناونیشانە کۆنەکە خۆی نامێنێت.**

**هەروەها دەست پیٚ بکە بە نوسین ناونیشانەکە بە www پرۆگرامی browser بۆ خۆی //:http بۆ زیا دەکات.**

لەبیرت بێت, پەنجە بنیٚ بە لـ **Enter** بۆئەوەی بدبات بۆ لاپەڕەکە.

## جووڵە Move لە نێوانی ئەو لاپەڕانەی کە دیدەنی مان کردوە

کە سەیری لاپەڕەیەکی وێب دەکەیت, لەوانەیە چەند ناونیشانێکی تر بەکاربهێنیت, بەلاٚم کە ئەو لاپەڕانە ئەو زانیارییەی تیا نەبو کە بەدوایا دەگەڕایت, ئەوکاتە دەتوانی بگەڕێتەوە بۆ لاپەڕەی پێشو یان پێش ئەویش, ئەم گڕانەوەیە ولاپەڕە هەلدانەوەیە دەتوانی بە بەکارهێنانی دوگمەی Back گەڕانەوە و دوگمەی Forward لەسەروی پرۆگرامی browser .




یەك کرتە لەسەر دوگمەی Back دەوگەڕێنێتەوە بۆ لاپەڕەی دووایی بینراو.  کرتە لەسەر دوگمەی Back چەندجارێك, ئەوەندە جار دەوگەڕێنێتەوە بۆ لاپەڕەی پێشوتر. گەر زۆر زیا گەڕانەوە, کرتەیەك لەسەر دوگمەی Forward , گەر دوگمەکە و نوسینەکەی شێوەکەی زەق بو, واتا دەتوانی کرتەی لەسەر بکەیت.

## جووڵە لە نێوانی لاپەڕەدا بە بەکارهێنانی لینکی Link ووشە و لینکی وێنە.

زۆربەی شوێنی وێب بریتیە لە چەند لاپەڕەیەك, نەخشەکێشی ئەم لاپەڕانە چەند جورێك ڕێگایان داناوە بۆ گەشتن پێیان. هەندیٚ وێب بریتیە لە یەك لاپەڕەی زور درێژ لەگەلٚ لینکسا **Link** بۆ بەشی جیاوازی لاپەڕەکە. هەندیٚ لینکس دائەنێن بۆ گەشتن بە وێب سایتی تر.  هەرجۆرێك لەم ڕێگایانە




بەکاربێت, گەیشتن بە زانیاری هەرِ هەمیشە ڕەگیان هەیە.

ئەم لینکسانە **Links** ناسراون بە هیپەرلینکس **"Hyperlinks"** , دوو جور لینك **Link** هەیە– لینکی ووشە و لینکی وێنە.

**لینەکی ووشە** – ووشەن کە لینکت دەکەن بە لاپەڕەیەکی ترەوە یان بە بەشی جیاوازی لاپەڕەکە یان بە وێب سایتێکی ترەوە.

**لینەکی وێنە** – ئەمە وەك لینکی ووشەیە, بەلاّم لەجاتی ووشە و نوسراو, وێنە بەکاردەهێنێت.

زانیاری

**کە مشکۆلەکە mouse دەجولێی بەسەر لاپەڕەدا, گەر شێوەی گۆڕا و لە تیرەوە بو بە دەست, ئەو ووشەیە یان وێنەیە یان بەشە لینکە بۆ لاپەڕەیەکی تر بە زانیاری تری تێدایە.**

**میوانی چەند وێب سایتێك بکە. بزانە دەتوانیت لینکی ووشە و وینە دیاری بکەیت کە نەخشەکێشی لاپەڕەکە بەکاری هێناوە. بیرت بیَ گەر وون بویت دوگمەی Back و Forward بەکار بێنیت بۆ جولاّنن لە نێوانی لاپەڕەکاندا.**

**دەرچون لە پرۆگرامی Browser پیشاندەر – Internet Explorer ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر**

ئەگەر تەواو بوون لە ئیش بە ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر **Internet Explorer** کرتیەك بکەن لەسەر دوگمەی **X** لای گۆشەی ڕاستی سەرەوەی شاشەکەت **screen** بەمە دەرئەچیت لە پرۆگرامی **Browser** ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر **Internet Explorer** .

پەیوەندیت لەگەلّ **ISP** هەر دەمێنیّ. ئاساییانە نامەیەك دەردەکەوێت لەسەر شاشەکەت و لیَت دەپرسیّ گەر دەتوێت پەیوەندی دابخەیت. کرتەیەك بکە لەسەر **Yes**.

دەوگەڕێنێتەوە بۆ دێسکتۆپ **desktop** . کۆمپیوترەکەت دەتوانی بکوژێنیتەوە بە کرتەیەك بکە لە سەر دوگمەی ستارت **Start** دوایی دوگمەی شەتداون **Shut Down**.

ئامۆژگاری

هەموکاتێك باشترە گشتی پرۆگرامە کراوەکان دابخەن, وەك وۆرد **Word** ئیکسلّ **Excel**, وێنەکێشانَ**Paint** پێش کوژاندنەوەی کۆمپیوتەرەکەتان.

ئەم کاتژمێرە  دەری دەخات کە نزیکەی چەنت وردگەو **minutes** پێویستە بۆ تەواوکردنی هەمو چالاکیەك. (خەمت نەبێ گەر زیاترت پێ چوو , هەموکەسێك جیاوازی هەیە لە هەنگاوی فێربوندا, بەئاسانی دەبێ بە رابەرێکی رەق.

## چالاکی 1

40 mins
40 وردگە

لە کوتایی ئەم چالاکییەدا , زانیاریای کۆدەکەیتەوە دەربارەی جیً بەجێ کردنی ئەم بنچینانەی خوارەوە:



- 1.1.1 داگیستانی کۆمپیوتەرو ئیش پێکردن بە پرۆگرام و بیوەیی (سەلامەتی) لە بەکارهێنان و خزمەتی کۆمپیوتەردا **(Including 3.1.2)**
- 1.1.2 ئیش پێکردن بە پرۆگرامی پیشاندەر **Browser** – ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر
- 1.1.3 هەڵبژاردنی لاپەڕە بە بەکارهێنانی ناونیشان **URL**
- 1.1.4 جووڵە لە نێوانی لاپەڕانەی لاپەڕەکاندا
- 1.1.5 جووڵە لە نێوانی لاپەڕەی وێبدا بە بەکارهێنانی لینکی ووشە **link words**
- 1.1.6 جووڵە لە نێوانی لاپەڕەی وێبدا بە بەکارهێنانی لینکی وێنە **link pictures**
- 1.1.7 دەرچون لە پرۆگرام و گۆڕانەوەی کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی ڕاست.

لەو چوارچێوەی خواروەدا, باسی بکە چۆن کۆمپیوتەر دادەگیستێنی. باسی سەلامەتی و ئاگاداریانەی کە دەیکەیت بکە, بەتایبەتی ئاگاداری کارەبا و نان و ئاو خواردن لە تەنیشت کۆمپیوتەردا.

بەڵگەی **1.1.1** و **3.1.2**

❑ باسی بکە لە خوارەوە چۆن ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر Internet Explorer دەخەیتە ئیش.

بەڵگەی **1.1.2**

❑ ئەم لیستەیەی خوارو بریتیە لە ناونیشانی چەند وێب سایت **URLs** . یەکێکیان هەڵبژێرە و تایپی بکە لەناو شریتی ناونیشان و برۆ بۆ وێب سایتەکەی.



- **www.bbc.co.uk**
- **www.lastminute.com**
- **www.argos.co.uk**
- **www.butlins.co.uk**
- **www.odeon.co.uk**

ئەوە ئەو لیستەیە نیە کە باسم ئەکرد!

❑ یەك لاپەڕە چاپ بکە. لە سەرەوی بنوسە بەڵگەی 1.1.2 , لاپەڕەکە کون بکە و بیخەرە ناو فایلەکت دوای ئەم لاپەڕەیە.

کە میوانی چەند لاپەڕی ئینتەرنێت کرد, دەشێ بگەڕێتەوە **back** بۆ لاپەڕەی پێشو یان بەرەو پێش **forward** بۆ لاپەڕەی دوایی کە لەسەری بویت.

❑ لەو چوارچێوەی خواروداْ باسی بکە چۆن دەتوانی بیکەیت بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت ئیکسپلۆرەر **Internet Explorer**.

بەڵگەی **1.1.4** ( ئەم ڕستانە تەواو بکە )

بۆ گەڕانەوە بۆ لاپەڕەی پێشو کرتەیەك **click** بکە لە سەر ..................................

..................................................................................................................................................

بۆ چونە سەر لاپەڕەی دوایی کە لەسەری بویت کرتەیەك **click** بکە لە سەر ...........................

..................................................................................................................................................




کە سەیری لاپەڕەیەکی وێب دەکەیت، دوو ڕێگا هەیە بۆچونەسەر لاپەڕەیەکی تر لەسەر هەمیشە وێب سایت.

❑ لەو چوارچێوەی خواروداْ بنوسە چەند جۆر لینکس **links** هەیە ؟

چالاکی 1.1.5

ئەمانە لینکس **link**. دەتوانی کرتەیەك **click** بکەیت لە سەری بۆ ڕۆیشتن بۆ لاپەڕەیەکی تر کە زانیاری زیای تێدایە

ئەمانە لینکس **link**. دەتوانی کرتەیەك **click** بکەیت لە سەری بۆ ڕۆیشتن بۆ لاپەڕەیەکی تر کە زانیاری زیای تێدایە

Halloween Costumes




Let the whole family dress-up as their favorite character. We have everything you need to create a fun Disney Halloween this holiday.

Featuring









- باسی بکە چۆن دەرئچیت لە پرۆگرامی ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر – Internet Explorer و کۆمپیوتەرەکە چۆن بەشێوەیەکی ڕاست دەکوژێنیتەوە.

بەڵگەی 1.1.7

## لێگەرانی ئینتەرنێت – شوێن دیاری کردنی زانیاری

**هەڵبژاردنی مەکینەی گەراندن**

**مەکینەی گەران Search Engine چیە ؟**

ئینتەرنێت چەندها ملیۆن لاپەڕەی لەسەرە و هەمو ڕۆژێکیش لە زیابونایە. کواتە چۆن زانیاری دەدۆزیتەوە ؟

گەر ناونیشانی وێب سایتەکە دەزانیت, ئەوکاتە کێشەت نیە, ناونیشانەکە تایپ بکە لە ناو شریتی ناونیشان.

گەر ناونیشانی وێب سایتەکە نەزانی, یان نەزانی لە کویَ ئەو زانیاریەی کە بەدوایا دەگەڕیت نیشتەجیَ بووەن, ئەوکاتە دەتوانی مەکینەی گەران Search Engine بەکار بهێنیت.

مەکینەی جل شتنەکەتان شکاوە

- دەگەڕێت بۆ سەرباس, نمومە "کارسازی ئاو"
- یەکێك دەدۆزیتەوە لە نزیکی جۆتان
- دوای ئەوە دووبارە دەگەڕێت لە ناو ئەنجامی یەکەم گەڕاندنت بۆ ئەو جۆرە مەکینەی جل شتنەی کە هەتە

هەمو مەکینەی گرانێك search engine کاتالۆگی لاپەڕەکانی وێب تێدایە, لەبەر ئەوە هندیَ کات پێویستە زیا لە یەك مەکینەی گران بەکار بهێنیت, بەلاَم لە ئەنجامدا بە یەك مەکینەی گراندا ڕازی

دەبێت و هەمیشە بەکاری دەهێنی. گشتی مەکینەی گەرانەکان search engine لاپەری یارمەتیان هەیە کە ئامۆژگاری و چۆنێتی گەراندنی تێدایە.

**چەند نمونەیەکی مەکینەی گرانی search engine گەلی .**

گووگڵ http://www.google.com
یاهوو **YAHOO** - http://uk.yahoo.com
ئەلْتاڤیستا **ALTA VISTA** – http://uk.altavista.com
لایکۆس **LYCOS** – http://www.lycos.com
ئیکسایت **EXCITE** – http://www.excite.com

مەکینەی گرانی لایکۆس ؟

مەکینەی گران جۆری تریشی هەیە, وەك نمونە **www.yell.co.uk** هەرچ کۆمپانیایێکی بەریتانیات بۆ دەدۆزێتەوە.



گەر پتەوێت پرسیار بکەیت ئەوکاتە مەکینەی گرانی وەك **www.ask.co.uk** دەیەلێت پرسیار بکەیت.

**بەکارهێنانی مەکینەی گەران Search Engine بۆ دۆزینەوەی زانیاری**

بەگشتی لەسەر لاپەڕەی مەکینەی گەران Search Engine چوارچێوەیەکی نوسینی box تێدایە دەتوانی ووشەی پێویستی تێدا بنوسیت بۆ دۆزینەوەی ئەوەی زانیاریەی بەدوایا دەگەرێت, دوای ئەوە دەست بنێ بە دوگمەی enter یان کرتەیەك بکە لەسەر ئەو دوگمەیەی کە لە تەنیشت چوارچێوەی نوسینەکەیە box بۆ ئەوەی گران دەست پێ بکات. مەکینەی گەرانەکە لە لاپەڕەکانی خۆیدا دەگەرێت و وەك ئەنجام لیستەیەکی links لینکس بۆ ئەو لاپەرانەی کە ووشەی keywords پێویستی تێدایە دروست دەکات وە دەیکات بە لاپەرەیەك. دەبێت لەو لاپەرەیەی ئەنجامەیا بگەرێت لە سەرەوە تا خواروی بۆ ئەو ئەنجامانەی کە بەدوایا دەگەرایت.

کە مەکینەی گەرانەکەت search engine ئەو زانیاریەی کە بەدوایدا دەگرایتی بۆ دۆزیتەوە (بە یارمەتی تۆ) ,ماوەتەوە لەسەرت لە لە لاپەرەی ئەنجامدا لە ناو ئەو لینکانەدا link بگەرێت. بەلاَم گەر بتەوێت ئەو ئەنجامانە بهێلیتەوە بۆ کاتی تر , دەتوانی ئەو لاپەریە بپارێزی save یان ناونیشانی لاپەرەی ئەنجام بپارێزی لە بەشی پەسەندا **Favorites** ( ئەمە باس دەکرێت لە چالاکی داهاتودا, دروست کردنی دەفتەری ناونیشان**Bookmarks** ).

- ❑ مەکینەی گەران بەکار بهێنە بۆ دۆزینەوەی وێب سایتی کۆلیچی شاری سەندەرلاند **the City of Sunderland College** web site




زانیاری

هەندێك نمونە و باسكردن دەربارەی مەكینەكانی گەران دەدۆزیتەوە لەسەر ئەم لاپەڕیە http://www.google.com

سەردانێكی چەند مەكینەی گەران پێشو بكە. سەرباسێك بنوسە كە دەتوێت بۆیبگەڕێت و سەیری ئەنجامەكان بكە. لەوانەیە ئەنجامێكی زۆر بدۆزیتەوە, جاری واهەیە سەدەها ئنجامە!. میواندارى هەندێكیان بكە كە بەلاتەوە بایەخن.

## پێرستی سەرباسەکان Topic Index بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی زانیاری

ئاساییانە، مەکینەی search engines گەڕان هەروەها دەیەڵێت بگەڕێت بۆ سەرباسێکی تایبەتی. لەجاتی ئەوەی بۆ گەڕاندن ووشە بنوسین، دەتوانیت کرتەیەك click بکەیت لەسەر سەرباسەکان **Topic** کە ئارەزومەندی زیاتری تێدایە لەسەر ئەو سەرباسە.

بایەخەکانت هەرچییێت، دەتوانی بەشداریان بکەیت لەسەر ئینتەرنێت.



- ❑ برۆ بۆ مەکینەی گەڕانی یاهو .YAHOO search engine (uk.yahoo.com)




- ❑ کرتەیەك click بکە لەسەر سەرباسێك topic کە بایەخی بلاتەوە وبزانە بۆ کوێت دەگەیەنێ!

## دروست کردنی دەفتەری ناونیشان Bookmarks بۆ ئەو لاپەڕانە و ناونیشانانەی کە میوانداریمان کردوە.

کە لاپەڕەیەکی وێبێ web page دۆزییەوە و بۆت دەرکەوت کە بەسوودە و دەتەوێ میوانداری بکەیتەوە، دەتوانی ناونیشانەکەی بپارێزی لە بەشی پەسەندا **Favorites** بۆ ئاسان کردنی دۆزینەوەی لە دوارۆژدا.

بۆ پاراستنی ناونیشانی وێب web address کرتەیەك click بکە لەسەر دوگمەی پەسەند (فەیڤرت) Favorites لەسەر شریتی ئامێرەکان toolbar لە سەرەوە, دوایی کرتەیەك بکە لەسەر دوگمەی **Add** لەو لیستەیەی کە بەردەبێتەوە.

ئەم پەنجەرەیە دەردەگەوێت :




خانەکان folders ناتوانن وەك یەکتربن, کەواتە خومت نەبێت.

❑ خانەیەك folder هەڵبژێرە بۆ پاراستنی ناونیشانی لاپەڕەکە و کرتەیەك click بکە لەسەر دوگمەی **OK**.

دەبێت مەکینەی گەرانی یاهو yahoo search engine ببینیت لە لای چەپی شاشەکە.




ئامۆژگاری

**بۆ لابردنی بەنجەرەی window پەسەند Favorites لای چەپ, کرتەیەك بکە لەسەر Favorites کە لەسەر شریتی ئامێرەکانە toolbar . ئەمە یان لیستەکە لادەبات یان دەری دەخات.!**

چەند لاپەڕەیەك سوودمەند بپارێزە لە دەفتەری ناونیشاندا Bookmarks کە لە دوارۆژدا پێتەوێت میوانداری بکەیتەوە بەخستنی بۆناو بەشی پەسەند Favorites. ئەمە رزگارت دەکات لە بیرکەوتنەوەی ناونیشانەکان, ئەو ناونیشانانە لەوانەیە زۆر درێژبن.

**بەکارهێنانی دەفتەری ناونیشاندا Bookmarks بۆ بارکردن وسەیکردنی لاپەڕەکان.**

ئێستا دەتەوێت ئەو لاپەڕەیە ببینیت کە پێشو پاراستبوت لە دەفتەری ناونیشاندا Bookmarks

- کرتەیەك Click بکە لەسەر بەشی پەسەند **Favorites** ئەمە گەر خۆی نەکرابۆوە. ئەو لاپەڕیە بدۆزەرەوە کە دەتەوێت بیکەیتەوە و دوو کرتە بکە لەسەر لینکی ووشەکە linked words. دەبێت ئێستا لاپەڕەکەت دەرکەوێت لە سەر شاشەکە screen




دوو کرتە بکە لەسەر لینك link بۆ کردنەوەی لاپەڕە

## چالاکی 2



له کوتایی ئەم چالاکییەدا ، زانیاریای کۆدەکەیتەوە دەربارەی جیً بەجیً کردنی ئەم بنچینانەی خوارەوە:

30 وردگە

- 1.2.1 هەڵبژاردنی مەکینەی گەراندن
- 1.2.2 شوێن دیاری کردنی مەکینەی گەڕان
- 1.2.3 بەکارهێنانی مەکینەی گەڕان Search Engine بۆ دۆزینەوەی زانیاری
- 1.2.4 پێرستی سەرباسەکان Topic Index بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی زانیاری
- 1.2.5 دروست کردنی دەفتەری ناونیشان Bookmarks بۆ ئەو لاپەڕانە و ناونیشانانەی کە میوانداریمان کردوە.
- 1.2.6 بەکارهێنانی دەفتەری ناونیشاندا Bookmarks بۆ بارکردن وسەیکردنی لاپەڕەکان.

بایەخەکانت هەرچیبێت، دەتوانی بەشداریان بکەیت لەسەر




گێڕانەوەی میکانیکێکی گەلی " لەوانەیە کێشی کۆمپیوتەر لە پاشەڕۆژدا لە 1,5 تەن زیاتر نەبێت"

لیستەی خوارو 3 سیناریۆی گەڕانەsearch scenarios .

- ❑ لە تەنیشت هەمو گەڕانێکەوەی خوارو بنوسە کام مەکینەی گەڕان search engine بەکاردەهێنیت.

**بەڵگەی 1.2.1**

مەکینەی گەڕان search engine: www.yell.co.uk, www.ask.co.uk, www.google.co.uk

1. کارسازی ئاوت پێویستە. ______________________________

2. لەکوێ دەتوانم زانیاری بدۆزمەوە لە سەر رۆژەپشو holidays ؟ _____________

3. بۆ ئۆتۆمۆبیل بگەڕێ ________________________________

❑ شوێن دیاری کردنی مەکینەی گەڕان بکە, وەك نمونە lycos, google, yahoo وە چاپی لاپەڕەکە بکە.

زانیاری




❑ بەڵگەی 1.2.2 لە سەرەوەی بنوسە, لاپەڕەکە کون بکە و بیخەرە ناو فایلەکت دوای ئەم لاپەڕەیە

ئێستا بۆ سێ شتی دەگەڕێت بە بەکارهێنانی مەکینەی گەڕان.

❑ شوێن دیاری کردنی مەکینەی گەڕانت کردوە. لە چوارچێوەی گەڕانا search box یەکێك لەم سەرباسانەی خوارو بنوسە یان سەرباسێکی خۆت بنوسە:

- **holiday**
- **sports car**
- **Asda**

❑ کرتەیەك بکە لەسەر دوگمەی گەڕان **Search** یان دوگمەی گۆ **Go** .

❑ تەنها چاپی ئەنجامی یەکەم لاپەڕەی گەڕانەکەت search بکە.

زانیاری



ئەم ئارەزوو ویستە هەڵبژێرە و بنوسە **1 to 1**. ئەمە دڵنیات دەکات کە تەنها یەکەم لاپەڕە چاپ دەبیت.



- ❑ بەڵگەی 1.2.3 لەکەڵ ئەو سەرباسەی **topic** بۆی گەڕایت لە سەرەوە بنوسە, لاپەڕەکە کون بکە و بیخەرە ناو فایلەکت دوای ئەم لاپەڕەیە.
- ❑ مەکینەی گەڕان **search engine** بەکاربهێنە بۆ گەڕان بە دوای دوو سەرباسدا topics. جارێکی تر, چاپی ئەنجامی یەکەم لاپەڕەی گەڕانەکەت search بکە و بیخەرە ناو فایلێکەوە.لەبیرتبێت بەڵگەی 1.2.3 لە سەرەوەی بنوسە !.

ئێستا 3 ئەنجامی گەڕانت دەست دەکەوێت.

**پێرستی سەرباسەکان Topic Index لە مەکینەکانی گەڕاندا**

بایەخەکانت هەرچیبێت, دەتوانی بەشداریان بکەیت لەسەر ئینتەرنێت.

- ❑ ئێستا لاپەڕەی مەکینەی گەڕانی یاهو **Yahoo** search engine (uk.yahoo.com) باربکەرەوە

دەبینیت کە سەرباسی **topic** چیاواز دەردکەوێت لە ژێر چوارچێوەی گەڕان search box

- ❑ سەرباسێك topic هەڵبژێرە لە پێرستەدا **index** . لە چوارچێوە box خواردوا ئەو سەرباسە **topic** بنوسە کە بۆی چویت لەگەڵ ناونیشانی ئەو لاپەڕەیەی میوانداریت کرد لە هەمیشە سەرباسدا **topic**.

**بەلگەی 1.2.4**

| Topic سەرباس | Web Page ناونیشانی لاپەڕەی وێب |
| --- | --- |
| Address | |
| .................................................. | ............................................................ |
| .................................................. | ............................................................ |
| .................................................. | ............................................................ |

- ❑ بە بەکارهێنانی دوگمەی **Back** چارێکی دی میوانداری ئەو لاپەڕانە بکەرەوە کە پێشتر لەسەری بویت یان یەکێك لەو ناونیشانانەی چالاکی پێشو بنوسە. 3 لاپەڕە بپارێزە بۆ ناو بەشی لیستەی پەسەند **Favorites**.

- ❑ باسی بکە چۆن 3 لاپەڕە دەپارێزیت لەگەل ناونیشانەکانی وێب.

**بەلگەی 1.2.5**

دەتوانی ناەنیشان لاپەڕە بپارێزیت بە

..........................................................................................................................

..........................................................................................................................

ئەو 3 لاپەڕەیەی ناونیشانەکەیم پاراست ئەمانەن

1.

2.

3.

- برۆ بۆ هەمویەکێك لەو لاپەڕانەی کە پاراستکراوە. لە چوارچێوەی خواروددا بنوسە چۆن دەتوانیت ئەو لاپەڕانە باربکەیت بە بەکارهێنانی بەشی پەسەند Favorite bookmark دەفتەری ناونیشان.

**بەلگەی 1.2.6**

بۆ بارکردنی ئەو لاپەڕانەی کە پاراستوتە من دەبێ bookmarked I

..................................................

........................................................................................................................

........................................................................................................................

# لێگەرانی ئینتەرنێت – پاراستن و چاپی زانیاری

## چاپی لاپەڕەی وێب Web Pages

بۆ ئەوەی چاپی لاپەڕەی وێب بکەی دەتوانی کرتەیەك click بکەی لەسەر ئایکنی چاپ print icon لەسەر شریتی ئامێرەکان toolbar.



هەرچۆنێك بێت, گەر ویستت تەنها یەکەم لاپەڕە یان لاپەڕەیەکی تایبەت چاپ بکەیت لەباتی ئەوەی گشتی لاپەڕەکان, برۆ بۆ دوگمەی فایل **File** دوای ئەو دوگمەی چاپ **Print**



لاپەڕەی **1 to 1** هەڵبژێرە. ئەمە تەنها چاپی یەکەم لاپەرەی دەکات. یان دەتوانی ئەو لاپەڕەیە هەڵبژێریت کە دەتەوێت چاپی بکەیت.

## پاراستنی لاپەڕەی وێب Web Pages بۆ سەر دیسكDisk

بۆ پاراستنی save لاپەڕە بۆ سەر هارد دیسك یان فلۆپی دیسك floppy disk , زۆر لە پاراستنی بەڵگەنامەی وۆرد Word document دەچێت.

فایل **File** هەڵبژێرە دواى ئەو پاراستن وەك **Save As**. بەمە پەنجەرەى خوارو دەكاتەوە:

درایڤێك drive هەڵبژێرە

دەتوانی ناوی فایلەکە بگۆڕیت

ئەم پەنجەرەیە **window** ئۆتۆماتیکی لاپەرەکە ئەپارێزێ **save** وەك لاپەرەی **html** (لاپەرەی وێب)، کرتەیەك بكە لەسەر **Save**

## گەڕان بۆ نوسراو **text** لە ناو لاپەرەی وێبدا **Web Pages**

کاتی واهەیە وێب سایتەکە **web site** بریتیە لە زیا لە 20 لاپەرە. گەڕان بۆ ووشەیەك زۆر ئیشێکی قورسە و درێژە.

- ❑ لاپەرەیەك بار بكە و سەیربكە. ووشەیەکی وا ئامادە بکە کە دەزانی لە ناو لاپەرەکەدا هەڵدەکەوێت، ئەمەش بۆ تاقیکردنەوەی ئیشکردنی ڕژێمەکەیە.

- ❑ کرتەیەك بكە لەسەر **Edit** دواى ئەو دۆزینەوە **Find** هەڵبژێرە

پەنجەرەیەکی تازە دەردەکەوێت

- ❑ ئەو ووشەیە بنوسە کە دەتەوێ بۆی بگەڕێت و کرتەیەك بكە **click** لەسەر دوگمەی **Find Next**




دەتوانانی کرتە بکەیت لە سەر دوگمەی **Find Next** تا گەڕان بە هەمو لاپەڕەکانا تێپەڕبێت.



### نوسراو ڕوونوس(کۆپی) **Copy** بکە

دەتوانی نوسراوی text لاپەڕەی وێب کۆپی copy بکەیت و بلکێنیت paste بۆ ناو پرۆگرامی وۆرد Word یان بۆ ناو هەر پرۆگرامێکی تر.

ئەمە یارمەتیەکی بەکارە, گەر نەتەوێت گشتی لاپەڕەکە بپارێزی save یان چاپ print بکەیت بەڵام پتەوێت بەشێکی بچکولەی برگەکە paragraph بەکاربهێنیت.

- ❑ لەو لاپەڕەیەی کە کردوتەوە, بەشێکی نوسراوە text هەڵبژێرە بە جوڵانی تیرەکە cursor بۆ سەر سەرەتای نوسراوەکە کە دەتەوێت کۆپی copy بکەیت. کرتەیەك بکە و پەنجە لە دەگمەی چەپی مشکۆلەکەت mouse هەڵ مەگرە تا ئەو بەشەی نوسراوەکە هەڵبژێری کە دەتەوێت.

- ❑ برۆ بۆ ئامادەکەر Edit و کۆپی Copy هەڵبژێرە لە لیستەیەی کە بەردەبێتەوە. نوسراوەکە text ئێستا کۆپی بووە بۆ ناو هەڵگری کاتی clipboard نادیار لە بیری کۆمپیوتەرەکەدا.



### لکاندنی **Paste** نوسراوە بۆناو وۆرد **Word**

- ❑ پرۆگرامی وۆرد بکەرەوە و لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبژێرە. برۆ بۆ ئامادەکەر **Edit** وەك ئەوەی لە چاری پێشوو کردت بەڵام ئەم چارە لە شریتی ئامێرگەی پرۆگرامی وۆردا Word Toolbar کرتەیەك بکە لە سەر لکاندن **Paste**.

ئێستا دەبێت ئەو نوسراوە text کە کۆپیت کرد دەرکەوێت لە سەر شاشەکەت screen

ئامۆژگاری

**ئاسایی یانە ئەو نوسراوەی text کە کۆپید کرد لە لاپەڕەی وێبەکەوە web page دەردەکەوێت لە بەڵگەنامەی وۆردا Word document بەهەمان شێوە, وەك نمونە کۆتایی ڕستەیەك لەوانەیە کورت و شڕۆوور بێت.**

Try formatting the text so that it looks better and fits across the width of the page.

**هەوڵ بدە نوسراوەکە چاك بکە بۆ ئەوەی شێوەی و درێژی لاپەڕەکە پڕ بکاتەوە.**

## Awareness of Copyright هوشیاری مافی لەچاپدان و بلاٌوکردنەوە

یاسای مافی لەچاپدان و بلاٌوکردنەوە Copyright دەستەبەرکراوێکە بۆ دروستکاری هەرچی دروستکەرێك و ڕەنجی و مافی بۆ بڕیاردانانی کێ دەتوانێ کۆپی Copy بکات, یان دروستکەرێك دادەڕێژێ لە بنەڕەتی کارێکی تر. گەر شتێکت دروستکرد و پێناسەی کاری دروستکەری پڕکردەوە, دەتوانیت بڕیار بدەیت کێ دەتوانێ کۆپی Copy بکات و شیوەی کۆپیکردنەکەی دیاری بکەیت.

یاسایێکی سادەی ئەوەی پەیوندی هەیە بە ئینتەرنێتەوە. گەر خۆت نەدنوسیوە و دەتەوێت چارێکی تر چاپی بکەیتەوە, لە دروستکارەکەی بپرسە. ئەمە بریتیە لە وێنە و نوسین و مۆسیقا یان دەنگ, ئەندێشەوێنە و هەر بەشێکی تری لاپەڕەکانی وێب WebPages . خاەونی چەند وێب سایتێك web sites کە وێنەی ئەکتەری فیلم و بەرنامەی تەلەفزیۆن دەخەنە سەر لاپەڕکانیان سەیریان لێ دێ کە نامەیان بۆ دێت لە پارێزەرەوە کە داوایان لێ دەکەن ئەو مادانەی مافی لەچاپدان و بلاٌوکردنەوەیان copyright هەیە و بێ مۆلەت بەکاری دەهێنن لایبەرن لە لاپەڕکانیانا.

بەلاٌم نائومێد مەبە, گەر دەتوێت هەندێ شت بەکار بهێنیت لە وێب سایتی web sites ترەوە. نامەیەك بنوسە بە پۆستی ئەلەکترۆنی بۆ تۆڕەوانی webmaster لاپەڕەکە (دروستکاری وێب سایتەکە) و داوای مۆڵەتی لێ بکە. زۆربەی کات ئەو مۆڵەتەت دەیەنێ.



پشوو بدە. هەوڵ مەدەو
زۆر کار مەکە!

## چالاكی 3



له كوتایی ئەم چالاكییەدا , زانیاریای كۆدەكەیتەوە دەربارەی جیً بەجیٰ كردنی ئەم بنچینانەی خوارەوە:

25 وردگە

- 1.3.1 چاپی لاپەڕەی ویٚب Web Pages
- 1.3.2 پاراستنی لاپەڕەی ویٚب Web Pages بۆ سەر دیسك Disk
- 1.3.3 گەڕان بۆ نوسراو text لە ناو لاپەڕەی ویٚبدا Web Pages
- 1.3.4 نوسراو ڕوونوس(كۆپی) Copy بكە
- 1.3.5 لكاندنی Paste نوسراوە لە لاپەڕەی ویٚبەوە web page بۆ ناو پرۆگرامی وۆرد Word



گویٚم لیٚبوە كەوا كەس نەمردوە لە پیٚداكەوتنی كۆمپیوتەركەدا

- ❑ بڕۆ بۆ ئەو سیٰ لاپەڕەیەی پیٚشو كە ناونیشانەكانیانمان پاراست. دەتوانی بە ئارەزوی خوت سیٰ لاپەڕە هەلٚیٚژیٚریت ! یەك چاپ لە هەر سیٰ لاپەڕەكە بكە. بەلاٚم چاپی print تەنها یەكەم لاپەڕە بكە.

- ❑ بەلگەی 1.3.1 لە سەرەوەی هەمو لاپەڕەیەك بنوسە, لاپەڕەكە كون بكە و بیخەرە ناو فایلەكت, دوای ئەم لاپەڕەیە

- ❑ ئیٚستا ئەو سیٰ لاپەڕەیەی كە ناونیشانەكانیمان پاراست, بپاریزە بۆ سەر درایڤی C drive

**بەلگەی 1.3.2**

لاپەڕەكانی ویٚبم web pages پاراسا لە سەر درایڤی C drive بە

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

..........................................................................................

- ❑ سەیری ئەو سێ لاپەڕەیەی چاپت کرد بکە. ووشەیەك هەڵبژیرە بۆ گەڕانی لە هەریەکێك لە لاپەڕەکان.

- ❑ هەریەکێك لە کان بە ریز باربکە و بۆ ووشەکە بگەڕێ search .

- ❑ لە چوارچێوەی خواروودا باسی بکە بۆ کام ووشەیە گەڕایت و چۆن کردت.

**بەڵگەی 1.3.3**

| لاپەڕەی وێب | ووشەی کە بۆی گیڕایت | ڕووودان |
|---|---|---|
| | | .1 |
| | | .2 |
| | | .3 |

توانیم بۆ ووشە بگەڕێم لە هەریەکێك لە لاپەڕەکاندا بە.......................

.....................................................................................................................

.....................................................................................................................

.....................................................................................................................



یەکەم نیشانەی کۆنبوونی کۆمپیوتەر چیە ؟ بیرچونەوە!

- ❑ بە بەکارهێنانی هەر ئەو 3 لاپەڕەی ویبە web page کە چاپتprint کرد، نوسراو text کۆپی copy بکە لە هەریەکێك لە لاپەڕەکان، (دوو رستە) دوای ئەوە نوسراوەکە بیانلکێنە **paste** بە بەڵگەنامەیەکی document نوێی پرۆگرامی ووردەوە word.
بەڵگەنامەی ووردەکەت ئێستا دەبێت سێ بەشی نوسراوەی تێدابێت.

- ❑ بەڵگەنامەکەی وۆرد چاپ بکە. بەڵگەی 1.3.5 لە سەرەوەی هەمو لاپەڕەیەك بنوسە، لاپەڕەکە کون بکە و بیخەرە ناو فایلەکت، دوای ئەم لاپەڕەیە .

له چوارچێوەی خواروودا بنوسه چۆن کۆپی copy نوسراوه text بۆ ناو هەڵگری کاتی clipboard و لکاندنیpaste بۆ ناو بەڵگەنامەی وۆرد Word.

**بەڵگەی 1.3.4**

نوسراوەکەم text کۆپی copy کرد له لاپەڕەی ویبەوە به یەکەم

..........................................................................................................................

..........................................................................................................................

دوای ئەوە نوسراوەکەم text لکاند paste بۆ ناو وۆرد به

..........................................................................................................................

..........................................................................................................................



"Did you get my email saying I would telephone you?"

## ناردن و وەرگرتنی پۆستی ئەلەکترۆنی – هوشیاری

### پیشاندان و تێگەیشتنی بیرۆکەی پۆستی ئەلەکترۆنیemail

بێ جیاوازی له کام وڵاته دەژیت, نرخی پەیوەندیکردن به پۆستی ئەلەکترۆنی email هەر نرخی پەیوەندی تەلەفونی خۆماڵیە (بۆ هەردووکیان ناردن و وەرگرتنی پۆستی ئەلەکترۆنی, ئەمە گەر یەکێکیان یان هەردووکیان گەیشتنیان به ئینتەرنێت به خۆرایی نەبێت) .
پۆستی ئەلەکترۆنی e-mail ریگایێکی مەزنه بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ خەڵکا له سەرتاسەی چیهاندا, ریگایێکی خێرا و هەرزانه نەك وەکو فەرمانگەی پۆست, ناردن و گەشتنی پۆست ئەلەکترۆنی رۆژانه 24 سەعات و هەفتانه 7 رۆژ کاردەکات. هوشیاربه ئەمه وەك نامەی ئاسایی نیه, پۆستی ئەلەکترۆنی تايبەت نیه. بەکارهێنانی پۆستی ئەلەکترۆنی, وەك نوسینی کارت وایه. خۆتلادە له نوسینی زانیاری نهێنی له ئی مەیڵەکانتا تا نامەکەت شفرە نەکەیت encrypt

پۆستی ئەلەکترۆنی e-mail زۆر خێرایه بەڵام گەر بێویستت به ناردنی زانیارێکی پێویست و گرنگ بۆ یەکێك, دەتوانی تەلەفون بەکار بهێنیت و پێی ڕاگەیەنیت کەوا نامەی ئەلەکترۆنیت بۆ ناردوه.
دەتوانیت پۆستی ئەلەکترۆنی e-mail بنێریت بەڵام وەرگرەکە پێی ناگات تا پەیوەندی نەکەن به

